2013

نووسەری کتێب : AnGrY BoY

ساڵی دەرچوون : هاوینی 2013

# باسێك لەسەر هاکەرز

AnGrY BoY : Describe Hackers

# به ناوی خوا

# باسێك لەسەر هاكەرز ( Hackers )




**پێرست :**

AnGrY BoY : Describe Hackers

**سڵاو بەڕێزان**

**لەو چەند دێرەی خوارەوە باسی هاکەرز دەکەین :**

**بزانین هاکەرز کێن و چۆن دەبیتە هاکەرز ، زۆر کەس پرسیار دەکات ئایە چۆن دەبم بە هاکەرز چیبکەم باشە بۆ ئەوەی فێری هاکببم وە یان چ زمانێکی بەرنامەسازی باشە فێری بم ئەو پرسیارانە و چەندین پرسیاری تر دەکەن کاتێك وەڵامێك وەردەگرێ پێیرازی نیە ! .. بۆ چونکە وەڵامێکی زانستی نیە بۆیە سەری لێدەشێوێ ماوەکی کەم خەریکی هەندێ بەرنامە دەبێ لە کۆتایی وازی لێدەهێنێ وا دەزانێ هاك هەر ئەوەندەیە ئەویش فێری بوو ئیتر تەواو .**

**فەرموو لەگەڵمان بن با کورتە باسێکی هاك بکەین .**

## 1- سەرەتا با بزانین کێن هاکەرز ؟

ڕۆژانە گوێبستی ووشەی هاکەرز دەبین و باسیان لێوەدەکەن بە تێکدەر و دز و چەتەی ئەنتەرنێت وەسفیان دەکەن کە هەڵدەستن بە تێکدانی ماڵپەڕ و کۆمپیوتەر و دروستکردنی جۆرەها ڤایرۆس و بڵاوکردنەوە یان ناردنی نامەی بێزارکەر (Spam) دزینی زانیاری تایبەتی کەسی و هەزاران کرداری لەو جۆرە . لە ڕاستی دا ئەوانە پێیان ناوترێ هاکەرز بەڵکو پێیان دەوترێ (Crackers) بە پێی وتەی Eric S. Raymond کە لە نوسراوێکدا بەناوی

(How to Become A Hacker) باس دەکات. چونکە هاکەرزی ڕاستەقینە ئەوانەنە کە بونەتە هۆی بەرەو پێش چوونی سیستەمەکانی ئیش پێکردن و بەرنامەسازی و بە هۆی دۆزینەوەی هەڵە لە بەرنامەکان و ناردنی بۆ کۆمپانیاکانی بەرنامەداڕێژەکان . نەك ئەو هەڵانە بەکار بێنن بۆ تێکدان و شێواندن و زیانگەیاندن بە بەکارهێنەران خۆی لە خۆیدا ئەوە شتێکی باش نیە هەر کاتێك تۆ هەڵەیەکت دۆزیەوە ئەوە یەکسەر بیکەیتە هەرا و ببیتە تێکدەر بەڵکو واباشترە ئاگاداری کۆمپانیاکە بکەیتەوە لەو کێشەیە چونکە لەوانەیە بتکاتە یەکێك لە ئەندامەکانی کۆمپانیاکەش چونکە تۆ هەڵەت دۆزیەوە کەواتە تۆ بەهێزیت بەڵام تێکدەر لە پێناو هیچ کەسێك خزمەت ناکات نە خۆت نە کەسانی تر .

AnGrY BoY : Describe Hackers

**پۆلێنکردنی هاکەرز دەکرێتە 3 جۆر .**




A. **كڵاو سپی ( White Hat Hackers)** خاوەن كڵاوی سپی یان هەندێك جار دەناسرێن بە (Ethical Hackers ) كە خاوەن ئەزموون و شارەزایەكی زۆرە لە بواری دۆزینەوەی هەڵەی پرۆگرامەكان و خاڵە لاوازەكان ئاگادار كردنەوەی خاوەنی لە كەم و كوری و پێشنیار كردن بۆ چاكردنەوەی یان ئەنجامدانی (Penetration Tester) یاخود بەرپرسیاری پاراستن لە كۆمپانیایەك ئەمە باشترین جۆری هاكەرن لە رووی رەووشتەوە پێیان ئەڵێن هاكەری بە ئەدەب چونكە حەزیان لەوە نیە ببنە گێرە شێوێن ئەتوانین بڵێین ئەوەیە هاكرز .

B. **كڵاوی رەش (Black Hat Hackers)** خاوەن كڵاوی رەش ئەوانە بە گوێرەی وتەی رایموند كە ئەو جۆرە كەسانە پێیان دەوترێ (Crackers) نەك (Hackers) ئەو جۆرە كەسانە شارەزایی و توانای خۆیان بەكار دێنن بۆ كاری تێكدانی سێرڤەر و ماڵپەر و كۆمپیوتەر و دزینی زانیاری نهێنی و حساباتی بانكی و دروست كردنی ناوبانگ و خۆ دەرخستن و هەندێ جار بۆ

AnGrY BoY : Describe Hackers

خۆشی دەرخستنی هێز بەرامبەر بێهێزەکان ، لە ڕاستیدا ئەتوانین بڵێین ئەمانە ئەو کەسانەن کە تازە دەست بە هاکردن ئەکەن چونکە حەز بەوە ئەکەن شتەکان تێك بدەن بە بێ هەبوونی هیچ مەبەستێك بۆ نموونە من حەز ئەکەم پەنجەرەیەك بشکێنم بێ ئەوەی مەبەستم هەبێت لە شکاندنی .

**C. کڵاو ڕەساسی (Gray Hat Hackers)** خاوەن کڵاوی ڕەساسی دەتوانین بڵێین ئەوانە وەك خاوەن کڵاو سپیەکان وان بەڵام هەندێ جار بۆ خۆ دەرخستن و پیشاندانی تواناکانیان کاری لەشێوەی کڵاو ڕەشەکان دەکەن .

لەکاتی دۆزینەوەی هەڵەیەك لە پرۆگرامێگ بۆ پیشاندانی ئاستی زانیاری و گەیاندنی نامە بۆ خاوەن پرۆگرامەکان .

کەواتە ئەو سێ جۆرەی سەرەوە کە باسمان کرد خاوەن شارەزایی و توانای زۆرن بەڵام جیاوازن لە شێوەی کارکردن مەبەستی کارکردنیان و گەیاندنی نامەکانیان .

بەڵام ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆ خۆیان بە هاکەرز دەزانن ئەوانە پێیان دەوترێ (Script Kiddies) .

ئەو جۆرانە زۆرن لە یانە و مەکۆ و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان ئەو جۆرە منداڵانە هەڵدەستن بە کاری تێکدەرانە بێئەوەی هیچ لە بابەتەکە بزانن تەنها بۆ پیشاندانی هێزو بازووی پێی وایە زۆرترین کاری تێکدەرانە بکات ئەوەندە بەهێزە .

وە ئەو جۆرانە تەنها بۆ ناودەنگ و خۆدەرخستن وادەکەن . ئەو جۆرە کەسانەش هاك دەکەن کە نەشارەزانە و تازەن لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر . بە شێوەیەکی هەرەمەکی ڕاست و چەپ دەکەوێتە ناو کەچی لای خۆی هاکەرزە نازانێ ئەویش تەنها بەکارهێنەرە !! چونکە خۆی ناتوانێ تەنها تاکە هەڵەیەك بدۆزێتەوە لە پرۆگرامێك چ (Desktop Application) بێت یان

(Web Application) بێ مەبەست لە Desktop Application واتە بەرنامەی کۆمپیوتەری وە مەبەست لە Web Application واتە بەرنامەی Online کە مەبەستمان لە ماڵپەڕەکانە. چونکە ئەو تەنها بەکارهێنەر و مشەخۆرە وا ڕاهاتووە کە (Exploit)ی ئامادە بەکار بێنێ وە ناتوانێ خۆی پێش بخا و ڕێگەی تازە بدۆزێتەوەوە ئەگەر هاتوو ئەو (Exploit) کە بەکاری دەهێنێت ئیش نەکات لەسەر پرۆگرامێك ئەوە وازی لێدەهێنێ بێ ئەوەی بزانێ کێشەکە لە چیە !!!

بۆیە بەکارهێنەر نابێتە هاکەرز بە هیچ شێوەیەك تا لە قۆناغی بەکارهێنەر نەچێتە قۆناغی داهێنەر

چونكە بەكارهێنانی بەرنامە هیچ زیرەكی و ماندووبونی ناوی بەتایبەت بەرنامە ئامادەكراوەكانی هاك چونكە هەمووی لە چەند پەنجەرەیەك تێپەرناكات بۆیە بەڕای من بەكارهێنانی بەرنامەیەكی وەك فۆتۆشۆپ زۆر زۆر ماندوو بون و زیرەكی زیاتر دەوێ لە بەكارهێنانی بەرنامەكانی وەك (RAT) ەكان و (php shell) كە لای ئێمە بەكارهێنەرانیان بە هاكەرز ناو دەبن !! كە بەكارهێنانیان و فێربوونیان تەنها نزیكەی نیو كاتژمێر زیاتری ناوێ !!! نازناوی هاكەرز ئەوەندە سادە نیە بیدەینە هەموو كەسێك ئەگەر بتەوێ ببیی بە هاكەرز ئەوە دەبێ وەك بەڕێوەبەری سێرڤەر دەبێ شارەزایی باشت هەبێ لە بەركارهێنانی سیستەمەكانی ئیشپێكردنی وەك لینكس و ویندۆز وە هەروەها دەبێ شارەزایت لە چەند زمانێكی بەرنامەسازی هەبێ بۆیە ئەگەر ببی بە هاكەرزی سەركەوتوو ئەوە دەبێ شارەزای لە هەردووكیان هەبێ هەم لە بەكارهێنانی سیستەمی ئیشپێكردن و هەم زمانی بەرنامەسازی چونكە ئەگەر نەزانی كۆمپیوتەر بەكاربهێنی چۆن دەتوانی هاكی بكەی !!!! ئەگەر لە زمانی بەرنامە سازی نەزانی چۆن دەتوانی هەڵە لە بەرنامەك بدۆزیەوە تا هاكی بكەی !!!! بۆیە ئەگەر شارەزای سیستەمێك نەبێت و نهێنی و خاڵە لاوازەكانی نەزانی ئەوە چۆن هاكی دەكەی !!؟؟ یان ئەگەر شارەزایی لە زمانی بەرنامەسازی نەبێ چۆن دەتوانی هەڵە لە بەرنامەیەك بدۆزیەوە بێگومان دەبێ وەك بەرنامەسازەكە شارەزای بەرنامە سازی بی تا ئەو هەڵەیە بقۆزیەوە كە تێی كەوتووە لە كاتی داڕشتنی بەرنامەكە وە دەبێ وەك بەڕێوەبەری سێرڤەرەكە شارەزابی تا بتوانی سێرڤەرەكە هاك بكەی . وە ئەوە بۆچوونێكی هەڵەیە كە كەسێك شارەزای لە بەكارهێنانی هەندێ بەرنامە هەیە پێیبڵێین هاكەرز چونكە نازانێ ئەو بەرنامەیە چۆن كاردەكات و چۆن دورستكراوە بەڵام هاكەرزی ڕاستەقینە ئەوەیە كە لە ڕێگەی شارەزایی لە سیستەم و بەرنامەسازی و ئەزموونی كاركردنی دەبێتە هاكەرز .

---

## 2- دەتەوێت ببیتە هاكەرز !!

لێرە كەمێك بوەستە پرسیار لە خۆت بكە باش بیربكەرەوە بۆچی دەتەوێ ببیە هاكەرز تەنها بۆ ئەوەی چەند كۆمپیوتەرێك هاك بكەی یان چەند ماڵپەڕێك هاك بكەی خەڵك پێت بڵێن هاكەرز و یان لە تۆڕێكی كۆمەڵایەتی كەسێ هەیە دەتەوێ هاكی ڕێزت بگرن و لێت بترسن !! یان لەچاتێك بكەی !!؟؟ یان وەك چاولێككردن و ناو بانگ !! ئەوە لێرەوە پێت دەڵێم وازبهێنە وە كات بە فیڕۆ

مەدە و خۆت هیلاك مەكە چونكە دەتوانی لە ماوەیەكی كورت چەند ماڵپەڕێك هاك بكەی و چەند كۆمپیوتەرێك هاك بكەی ئەو خەونەی تۆ بەوەندە دێتە دی بەڵام ئەگەر دەتەوێ ببی بە هاكەرزی ڕاستەقینە و لە بواری پاراستن و هاك ئیش بكەی وەك پیشە ئەوە ئەو ڕێگەیە ئەوەندە كورت نیە بە چەند مانگێك كۆتایی پێبێنی وەك ئەوەی چەند بەرنامەیەك بێ فێری ببی و تەواو ئەو بۆچوونە زۆر هەڵەیە ئاگاداربە ماندوو بوون و ئارامگرتنی زۆری دەوێ چونكە ئەوە ئیشی رۆژ و حەفتە و مانگ نیە چەند ساڵی دەوێ تا فێری ئەو شتانە دەبی كە پێویستە فێری ببیت وەك شارەزای بەكارهێنانی سیستەمەكانی ئیشپێكردن و بەرنامەسازی و بەستانی تۆڕ (شبكات) دۆزینەوەی هەڵە لە بەرنامەكان و شكاندنی پاراستنی بەرنامە

دەگاتەشێوازی فێڵ(Social Engineering) وەبگرە تا ( Reverse Engineering ) چونكە هەموو ئەوانەی باسمان كرد پێویستت پێیاندەبێ بۆیە ئەوەندە ئاسان نیە فێری ئەو هەموو شتانەبی لە ماوەیەكی كەم دا بۆیە كاتێكی باشی دەوێ ئەوەش مانای ئەوەنیە كە مەحاڵە كەس فێر نابێ بەڵام مانای وایە هەموو كەس فێرنابێ و بە ئاسانی فێر نابێ بۆیە ئەگەر ئامادەیت و ئارام دەگری و بەو ڕێگە دروستە دا دەڕۆی كە باسمانكرد ئەوە فێردەبی و دەبیە خاوەن ئەزموونێكی باش .

---

## 3- چۆن دەست پێبكەم و لە كوێ دەستپێبكەم ؟؟؟

بەتەواوی ڕێگەیەك و ڕێڕەوێكی دیاری كراو نیە بۆ دەست پێكردن بەڵام ئەوەی لەسەرەتا بەڕێك و پێكی دەست پێبكات ئەوە بێگومان چاكترە لەوەی بە پەرت و بڵاوی هەنگاوەكان بنێ چونكە سەرەتا كۆتایی دیاری دەكات . زۆربەی كەس كە دەست پێدەكات سەرەتا لە هاكردنی ئیمێڵ دەست پێدەكات بە پەڕەی تەزوویر و پاشان دەچێت بەرنامەی ئامادە ئیش پێ دەكات وەك (KeyLoggers) وە پاشان دەچێتە هەنگاوی دواتر هاكردنی كۆمپیوتەر بە بەرنامەی ئامادە وەك : ( Bifrost و Poison Ivy) و (ProRat , NjRat) وە چەندین بەرنامەی تر بەكارهێنانی هەڵەی براوسەرەكان تەنها لینكی (server) دادەنێ هەركسێك بیكاتەوە ئەوە

AnGrY BoY : Describe Hackers

دادەبەزێتە ناو کۆمپیوتەری کەمێك خۆی پێشدەخات ماڵپەڕ هاك دەکات لە ڕێگەی هەڵەی سکریپتەکان گەڕان لە گوگڵ بەشێوەیەکی هەڕەمەکی وە بەکارهێنانی (php shell) وەك

(c99 , r57) یان (SQL Injection) دواتر دەگاتە ئاستی هاکردنی بەکارهێنەرانە ناو شەبەکە لەڕێگەی (Sniffers) د وا هەنگاو دەگاتە ئاستی بەکارهێنانی پرۆژەی مێتاسپلۆیت بۆ هاکردنی کۆمپیوتەر و سێرڤەر بەڵام ئەوە هەموو تەنها بەکارهێنانە بەڵام نازانی چۆن ئیشدەکات بۆیە دەبیتە بەکارهێنەرێکی زۆر باش بەڵام لێرەوە کۆتایی دێت دەوەستی ، وادەزانی ئیتر تەواو هاك هەر ئەوەندە بوو ئەوەیش فێربوو !!!! بەڵام کە دەگاتە ئەو ئاستە دەبینی کە ئەوەی چەند ساڵە خەریکی بووە تەنها کات بەفیرۆدان بووە بێئەوە بەڕێگەیەکی دروست خۆی پێشخا و بەردەوام بێت چونکە جیهانی هاك و پاراستن کۆتای نیە بەخێرایی دەڕوات ئەوەی ساڵێك لەمەوبەر دەیزانی ئەمڕۆ سوودی نیە بۆیە دەبێ بەردەوام بی چاودێری ئەو ڕێرەوە بکەی و لەگەڵی بڕۆی چونکە یەك ڕۆژ دابڕێی دەبێ سبەی باجەکەی بدەی .

**ئەی چارە ؟؟ چی بکەین تا بە ڕێگەیەکی دروست فێری ببین ؟؟**

سەرەتا پێویستە شارەزای تەواوی بەکارهێنانی سیستەمی ئیشپێکردنی وەك (Windows و Linux) بی چونکە ژینگەی ئیشکردن پاشان شارەزابوون لە بنچینەی (Network) چۆنیەتی کارکردنی (TCP/IP) شارەزابوون لە شیکردنەوەی (Packets) چۆنیەتی پاراستنی و بەڕێوەبردنی سێرڤەر دواتر شارەزا بوون لە زمانەکانی بەرنامەسازی چونکە ئەوانە بنچینەی فێربوونە بێ ئەوانە ناتوانی هیچ بکەی چونکە ئەگەر شارەزای بەکارهێنان و پاراستنی سێرڤەر بی ئەوکات ئاسانە بۆت چۆن خاڵە لاوازەکانی دەقۆزیتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆت پاشان بەکارهێنانی بەرنامەی تایبەت بە تاقیکردنەوەی پاراستن و شیکردنەوەی هەڵە بۆیی پێویستە چەندین شت فێربی لە یەك کاتدا بۆ شارەزابوون لە شتێك ، وە هەروەها دەبێ بە بەردەوام زانیاریەکانت نوێ بکەیتەوە و دانەبڕێیت .




### 4- گرنگی شارەزابوون لە سیستەمی ئیشپێکردن لە بواری هاکدا (Operating System)

**سیستەمی ئیش پێکردن چیە ؟؟**

واتا ئەو سیستەمەی کە لەسەر کۆمپیوتەر دادەبەزێنی وەك لینکس و ویندۆز ... هتد

بەرنامەکانی لەسەر ئیشپێدەکەی چونکە ئەگەر سیستەمی ئیشپێکردن نەبێ کۆمپیوتەریش بونی نابێت ئەوەی وەك ناوی خۆت لە بیرت بێت ! شارەزابوون لە سیستەمێکی وەك لینکس زۆر گرنگە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێ ببێ بە هاکەرز چونکە سیستەمێکی سەرچاوەکراوەیە بۆشایەکی زۆرت پێدەبەخشێ بۆ ئیشپێکردن مەبەست لە سەرچاوە کراوە واتە (توانای دەستکاری کردنی سیستەمەکەت هەیە ). وە زمانەکانی بەرنامەسازی وەك (Perl , Python , Ruby) زۆر بە باشی لەسەر ئەو سیستەمە ئیش دەکەن وە هەروەها بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاو بەکاردەهێندرێت بۆ سێرڤەر و نێتۆرك بە هەموو جۆرەکانیەوە .

بۆیە شارەزابوون لەو سیستەمە زۆر گرنگە لە بواری هاکدا شارەزابوون مەبەستم ئەوەنیە چەند فرمانێك و رێکخستنی هەندێ بەرنامە بەڵکو شارەزابوون بە مانای ووشە شارەزابوون لە هەموو لایەنێکی هەم لایەنی پاراستنی و دامەزراندی بەرنامەکان و شارەزابوونی بەکارهێنانی بەرنامەکان و چۆنیەتی ئیشکردنی بەرنامەکان چونکە سیستەمەکە کراوەیە بۆیە ئاسانە تێگەیشتنی لە چۆنیەتی

کارکرنی سیستەم و بەرنامەکان . چونکە هەموو ئەوشتانەی کە فێری دەبی سوودی لێوەردەگری لە بواری هاك دا .

وە سیستەمەکانی تر کە داخراون تەنها کۆمپانیای بەرهەم هێنەر بۆی هەیە تازەی بکاتەوە و بەرە و پێشی ببا بەڵام سیستەمی لینکس کراوەیە هەزاران کەسی شارەزا بەشدارن لە بەرەوپێشبردنی لە ڕووی پاراستنەوە باشترە لە سیتەمەکانی تر و هەروەها سیستەمی ویندۆزیش گرینگی زۆری هەیە لە بواری هاکدا ئەوی لەسەرەوە باسمان کرد مانای ئەوە نیە کە سیستەمی ویندۆز بێ سوودە ! چونکە دەبێ پێشئەوەی بچیتە سەر سیتەمەکانی تر دەبێ شارەزای سیستەمی ویندۆز بی چونکە زۆرترین بەکارهێنەری هەیە وە بەشێوەیەکی زۆر بەکاردێت لە بواری نێتۆرکینگ و سێرڤەر وەك لینکس وە هەروەها زۆربەی ئەو بەرنامانەی بۆ (Penetration Testing)

بەکاردێ لەسەر سیستەمی ویندۆز ئیش دەکەن بەتایبەت ئەو بەرنامانەی کە بازرگانین واتا دەبێ بە پارە بیانکری ئەوانە زۆربەیان تەنها لەسەر ویندۆز ئیشدەکەن نەك لەسەر لینکس بۆیە دەبێ سوود لە زۆرترین بەرنامە وەرگری تا زیاتر شارەزابی ئاسانترە فێربوونی هاك وە ئەوەش بزانە سیتەمی ئیشپێکردن ئامانج نیە تەنها ڕێگەیەکە پێی دا دەرۆی بۆ ئامانجەکەت کە فێربوونی هاکە . وە دەتوانی هەردوو سیستەم بەکار بێنی لە یەك کاتدا وە لەسەر کۆمپیوتەر لەڕێگەی بەرنامەی تایبەتیەوە وەك بەرنامەی ( Virtual Box و VMware ) .

---

## 5– زمانەکانی بەرنامە سازی و گرنگی لە هاکدا (Programming Language)

**AnGrY BoY : Describe Hackers**




سەرەتا با بزانین زمانی بەرنامە سازی چیە ؟؟ وە پاشان باسی گرنگی بەرنامەسازی دەکەین لە بواری هاکدا .....

بەرنامە سازی لە پێناسەیەکی سادە / بریتیە لە نوسینەوەی کۆد لەڕێگەی ئەو کۆدانە داوا لە کۆمپیوتەر دەکەی کە کردارێکت بۆ جێبەجێبکات .

زمانی بەرنامەسازی لە پێناسەیەکی سادە / بریتیە لەو کۆدانەی کە دەنووسرێتەوە دەنێردرێت بۆ کۆمپیوتەر تا جێبەجێیکا .

کۆمپیوتەر تەنها یەك زمان تێدەگات ئەویش زمانی (0,1) واتا سیستەمی (Binary) چونکە ئامێری کارەبای تەنها دوو حاڵەت وەردەگرێ یان هەیە یان نیە ، بەواتایەکی تر یان راستە یان هەڵەیە بۆیە گەر بمانەوێ بنوسین hello ئەوا پێویستە بەو شێوەیە بنووسین

01101000 01100101 01101100 01101100 01101111

بێگومان بەم شێوەیە هەم بۆ نووسینەوە زەحمەتە هەم تێگەیشتنی بۆیە پێویستمان بە وەرگێڕێك دەبێ لە نێوان ئەو جۆرە زمانە و مرۆڤ و کۆمپیوتەر . لێرەوە زمانەکان ڕۆڵی خۆیان دەبینن لە وەرگێرانی کۆدەکان بۆ کۆمپیوتەر و کۆمپیوتەریش جێبەجێیدەکات

AnGrY BoY : Describe Hackers




نامەوێ زیاتر لەسەر زمانی بەرنامە سازی بڕۆم زۆری پێویستە ئەگەر بمانەوێ بە تەواوی باسی بکەین

با بزانین گرنگی بەرنامە سازی چیە لە هاك ؟؟ بەزمانێکی سادە و ساکار هاك بریتیە لە سوود وەرگرتن لە هەڵە . ئەو هەڵەیە چ لە بەکارهێنەر بێ یان لە بەرکارهێندراو واتا تۆ چ کەسێك هاك بکەی دەبێ سوود لە هەڵە وەرگری وەك نەزانین نەشارەزای لە خۆپاراستن !!! وە ئەگەر کەسەکە شارەزا بوو ئەو کات دەبێ پەنا ببەیتە بەر رێگەی تر وە هاکردن لە رێگەی بەرنامەکان ئەو کاتیش دەبێ سوود لە هەڵەی بەرنامەکە وەرگری .

بۆ نموونە : ماڵپەرێکی هەیە دەتەوێ هاکی بکەی یەکەم جار هەوڵ دەدەی لەرێگەی خاوەن ماڵپەرەکەوە ماڵپەرەکەی هاك بکەی وە گەر خاوەنەکەی شارەزا بوو ئەوکات دەبێ پەنا ببەیە بەر ئەو بەرنامەیە کە ماڵپەرەکەی پێ دورست کردووە

نموونە: ئەگەر بە زمانی (php) دروستکرابوو چی دەکەی ئەگەر هیچ لەو زمانە نەزانی !!؟؟ بێگومان تۆ ناتوانی هەڵە لە شتێك بدۆزیتەوە بێ ئەوەی شارەزابی ! بۆیە زانینی زمانەکانی بەرنامە سازی زۆر گرنگە لە بواری هاکدا وە ئەگەر زمانەکان بزانی ئەوە کاتێکی زۆرت بۆ دەگەڕێتەوە زۆر کار ئاسانیت بۆ دەکات لە هاکردنی ماڵپەڕ زۆر زمان هەیە کە بەرنامەی وێبی پێ دروست دەکرێ ئەگەر شارەزای لە زمانەکان هەبێت دەتوانی بەسانی هەڵەی لێ بدۆزیتەوە وەك هەڵەی : (File include, XSS, CSRF , SQLInjection ....etc ) بەڵام ئەگەر زمانەکان نەزانی دەبێ چاوەڕێی کەسێکی شارەزا بکەی تا هەڵەیەك لە بەرنامەیەك دەدۆزێتەوە پاش ماوەیەك بڵاوی دەکاتەوە دەبێ وەك مشەخۆر لەسەر بڵاوکراوەکان بژی !! وە هەروەها بە نسبەت بەرنامەکانی دیسکتۆپ بەهەمان شێوە دەبێ شارەزایی لە زمانەکان هەبێ بۆ بەدوادا چوونی هەڵەکان. شارەزای زمانی (C , Assembly ) بی وە هەروەها شارەزا بوون لە بەکارهێنانی بەرنامەی تایبەتی بە Reverse Engineering وەك : OllyDBG , IDA Pro بزانی چۆن بەرنامە لەگەڵ کۆمپیوتەر کاردەکات کەی و چۆن حاڵەتی Buffer Overflow ڕوودەدات وە بتوانی بەکاریبێنی بۆ مەبەستی ڕاگرتنی سیستەم یان بەکارهێنانی Shell Code

AnGrY BoY : Describe Hackers

بۆ هاكردنی سیستەم .

ئەمانەی باسمان كرد و زۆر شتی تر هەیە كە بوار نەبوو باسی بكەین بۆ گرنگی بەرنامە سازی له بواری هاكدا بەڵام مانای وا نیە هەموو زمانەكان بزانی و شارەزای هەموو زمانەكان بی چونكه كاتێكی زۆری دەوێ تا فێری ئەو هەموو زمانە ببی بۆیە پێویست ناكات هەموو زمانەكان فێرببیت بەڵام لە سەرەتاوە دەبێ بە پێی ڕێڕەوێكی دروست دەست پێبكەی چونكه هاك بۆ خۆی جیهانێكه لە فراوان بوون دایە . لێرەوە پرسیارێك دێتە پێشمان كامە زمانی بەرنامە سازی گونجاوە بۆ دەستپێكردن ؟؟ وەڵام دانەوەی ئەو جۆرە پرسیارانە ئاسان نیە بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت شتێكی لەسەر دەنووسم . سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین هەندێ زمان هەیە كە زۆر گرینگن بەڵام بەكەڵكی ئەوە نایە لە سەرەتاوە دەست بەو جۆرە زمانانە بكەی

وەك زمانەكانی : (C++ , C , Assembly)

ئەو جۆرە زمانانە زۆر ئاسان نیە فێربوونی چونكه كاتێكی زۆری دەوێ تا فێری دەبی كاتێكی زۆری دەوێ تا بەرنامەی پێداڕێژی بۆیە باشتر وایە لە سەرەتا فێری زمانێكی ئاسان ببیت و لەسەر هەموو سیستەمێك ئیشی پێبكرێ نەك زمانێك تەنها لەسەر سیستەمی ویندۆز ئیش بكات وەك Visual Basic كە تەنها لەسەر سیستەمی ویندۆز ئیشدەكات . بۆیە زمانەكانی وەك Python , Perl , Ruby ئەو زمانانەی زۆر ئاسانن و دەبنە بناغەیەك بۆ فێربوونی زمانەكانی تر چونكه زۆربەی زمانەكان لە سەر زمانی ( C) بنیات نراون بۆیە ڕاستە ئەگەر بڵێین زمانی ( C) دایكی زمانەكانی ترە .

وە ئەوە هەڵەیە كاتێك كەسێك دەڵێت ئەو زمانە گرنگترە لەو زمانە چونكه هەموو زمانەكان گرنگی خۆیان هەیە بۆ نموونە زمانی (PHP) دەتوانی بەرنامەی ماڵپەڕی پێ دروستكەی و Desktp Application ی پێ دروست بكەی بەڵام گرنگی زمانی (PHP) لە دروستكردنی بەرنامەی وێبە نەك Desktp Application.

هەموو زمانەكانی تر بەم شێوەیە دەكرێ بگوترێ كامە زمان بۆ تۆ و كارەكانت گونجاوە چونكه تۆ تەنها دەبێ ڕێگایەك هەڵبژێری بەرنامەی وێب یان بەرنامەی دیسكتۆپ ئینجا بڕیار بدە كامە زمان ئیش و كارەكانت ئاسانتر دەكات خێراتر بەڕێوە دەبات . لە كۆتایی ئەوە ماوە بڵێم زمانی بەرنامەسازی گرنگە دبێ فێری بی زوو یان درەنگ . با زیاتر لە سەر زمان نەڕۆین بێینەوە سەر باسی هاك بۆ ئەوەی سەركەوتووبی وا باشە هەنگاو هەنگاو بەرە و پێش بڕۆی پەلەنەكەی لە فێربوون زۆر شت تاقی بكەیەوە بابەت بخوێنیەوە بەدواداچوونت هەبێ شێوازەكانی و ڕێگاكانی هاك تاوتوێ بكەی وەك كرداری (Buffer overflow) كە زۆر گرنگە و ترسناكە لە

**AnGrY BoY : Describe Hackers**

کاتێکدا ڕوودەدات لە زاکیرەی پردەبێ توشی ئیفلیجی دەکات . وە هەروەها کرداری (Sniffing ) لە سەر شەبەکەدا ئەنجام دەدرێ وەك ئەوە وایە هەست ڕاگری لە دورەوە بزانی چ دەگوزەرێ لە ناو شەبەکە زانیاری هاتوو دەرچوو وەرگری بەکاری بێنێ بۆ مەبەستی خۆت ، وە چەندین کرداری تر وە هەروەها شتێکی تر هەیە با لە بیری نەکەین ئەویش پێیی دەڵێن

(Social Engineering)  زۆر گرنگە و پێویستە شارەزابی بۆ کۆکردنەوەی زانیاري پێویست و هەڵخەڵەتاندنی کەسی بەرامبەر .

وە بێگومان لە کاتی ئەنجامدانی کرادرەکانت زۆر کۆسپ و تەگەرە دێن پێشت بۆیە دەبێ زۆر بە وریایەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە کێشانە بکەی نەوەك هەر کە توشی کێشەبووی وازی لێبینی و دەستبەرداری بێ چونکە**( لە بوونی کێشە چارەسەر دەدۆزیەوە لە دۆزینەوەی چارەسەر شت فێردەبی وە باشترین کەس لێی فێربی خۆتی)**پێت سەیر نەبێ چونکە تۆ هەرکێشەیەکت بێتە پێش و پەنا بەری بۆ کەسێك بۆت چارەسەرکات تۆ هیچ فێرنابی بۆیە خۆت هەوڵبدە کاتژمێرەك و دوو سێ تا بگرە ڕۆژێکت بوێ بۆ چارەسەر باشترە لەوەی پرسیار بکەی لە کەسی تر چونکە خۆت کێشەیەکت چارەسەر کرد هەرگیز لە بیری ناکەی بەڵام ئەوەش مانای وانیە هەرگیز پرسیار نەکەی ئەگەر هەر هیچ چارەت نەما ئەوکات پەنا ببە بەر (گووگڵ) باشترین هاوڕێ و مامۆستایە

**+ دوا وتە :**

لە کۆتایی دا هیوادارم  بەو چەند دێرەی سەرەوە توانیبێتم خزمەتێکی بچووکی ئێوەی بەڕێز بکەم ، بێگومان ئەو زانیارانەی سەرەوە هەمووی لە ئەنجامی تاقی کردنەوەی رۆژانەی خۆم و برادەران و گەڕان لە ئینتەرنێت خوێندنەوەی بابەت کۆمکردیتەوە . بۆیە چاو پۆشی لە هەڵەکانم بکەن وبم بەخشن .


AnGrY BoY

H4KurD-TeaM

www.h4kurd.com

E-Mail : h4kurd@yahoo.com